- لە ساڵی ١٩٧٢ دا. گروپێك لەو كادرانەی لە ئەلقە رۆشنبیریەكانی سەرەتای دامەزراندنی كۆمەڵەدا نەخشیان هەبوو جیابوونەوەی رێكخراوێكی بچووكی داخراویان بۆ خۆیان درووست كرد. ئەوان دەڵێن دوو بیانووی سەرەكیان بۆ رەت كردنەوەی كۆمەڵە و بەجێ هێشتنی هەبووە:

١- كۆمەڵەیان بە پردێك زانییوە لە نێوان مەرگی جەلالیەت و دووبارە زیندووبونەوەیدا واتە ئەوان وایان بینیوە كە كۆمەڵە لە هەل و مەرجی بەیانی ١١ ی ئازار و شكست خواردنی باڵی م.س دا دەبێتە دارە ئەفسووناویەكەی حەزرەتی موسا بەدەست مام جەلالەوە و بەشێنەیی و لەبار و دۆخێكی تر دا بە ئالأیەكی دی كەوە، جەلالیەتی پێ زیندوو دەكاتەوە.

٢- لایان وابووە كە لەنێو كۆمەڵەدا مەیلی گۆشە گیری نەتەوایەتی چەكەرەی كردووە و كۆمەڵە رێكخراوێكی ماركسیستی نەتەوە پەرستە بێ ئەوەی بەنامەیەكی روونیشی بۆ چارەسەرە كردنی كێشەی نەتەوەی كورد هەبێت و وتارەكانی مام جەلال لەمەر(كوردایەتی خاس و عام كە لەیەكێك لە ژمارەكانی رۆژنامەی برایەتی ئەو ساڵەدا بلاّو كرابووە و هەڵەیەكی لەنێوان كۆمەڵەدا نابووەوە)سەرچاوەی ئیلهامی فیكری كۆمەڵەیە.

ئەم باڵە بلاوكراوەیەكی نهێنیان بەناوی(كۆمەنیست)دەردەكرد و وەكو گروپێكی بچوكی نهێنی تا ساڵی(١٩٧٦)یش مابوون و چەند جارێك لەقەرەداخ لەگەڵ شەهید ئارام دا گفتوگۆ و دانوستاندیان كردبوون. شەهید ئارام هەوڵی دابوو كە قەناعەتی ئەوەیان پێ بكات كە كۆمەڵە زۆر گۆرانی بەسەردا هاتووە و ئیتر كۆمەڵەی(عەحدی بايد !!)نییە. ئەو گروپە لەگەڵ ئارام دا پێك نەهاتبوون و پاشان(قیادەی مەركەزی حشع — وەحدەت القاعدە)قوتی دابوون.

٣- لە كۆتای ساڵی ١٩٧٥ و سەرەتای ١٩٧٦ دا، گروپێكی تر لەكادر و ئەندامانی كۆمەڵە بەشێك لەتەلاری رێكخراوەیان بۆ خۆیان بردا و رێكخراوێكی نوێیان بەناوی(رێكخراوی رەنجدەران)ەوە دامەزراند و بەشێكی بەرچاوی كادر و ئەندامنی كۆمەڵەیان جیاكردەوە. رەنجدەران بە پێچەوانەی گروپی كۆمەنیستەوە، بەخێرای گەشەیان كردن و هەر بەخێرایش ئاش بەتاڵیان كرد یان پێیان كرا !!

رەنج دەران لایان وابوو.

١-	كۆمەڵە دەبێت قەوارەی رێکخراوەی سەربەخۆی بپارێزێت و چوارچێوەی سیاسەت و تەلاری(یەکێتی نیشتمانی کوردستان)قبوڵ نەکات و وەلای بنێت.

٢-	کۆمەڵـە دەبێـت بەرنامەیـەکی ئاشـکرایی لەسـەر مەسـەلەی عێـراق و چـۆنیەتی هاوکاری نێوانی خۆی و هێزە چەپەکانی دیکەی عێراق هەبێت.

رەنج دەران بروایان بە خەباتی شاخ هەبوو لـە چـیادا مـەفرەزەی چـەك داریـان دروست کرد , سالێکی نەخایاند لێپرسراوێکی سەرکردایەتیان بەناوی(ابراهیم حسن)لەرێگەی نێوان هەڵبجـە و سـلێمانی دا، پێـشمەرگەیەکی تەسـلیم بـوەوەی کۆمەڵـەی بـەگرتی دا و ئـەویش هەموو رێکخراوەکەی خۆی و بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵـەی بـەگرتن و ئیعـدام کـردن دا و بۆ خۆشی پاشان بەر لێبوردن کەوت و ئێستا لە هەندەران دەژی چـەك دارەکـانی شـاخیان و بەتایبەتی مەسئولی یەکەمیان لە هەل و مەجێکی ئالۆزدا تیاچـوون و بەیـەك جـاری کۆتـای پێ هات !!.

ئەم روداوانە ئەڵقە ژەنگرتووە لە گۆران کراوەکانی مێژووی کۆمەڵەن کە تاو تـو کـردن و لێکۆڵینەوەیان دەشێ کۆمەلیك دەرز و پەندمان بـدەنێ جگـە لـەم دوو روداوە گرنگـەی نێـو مێژووی کۆمەڵە، زۆر دیاردە و دەرکەوتنی دی کە هەن کە نوسەر بازی بەسەردا داون و مـن لە دەرفەتێکی تر دا هەوڵ دەدەم باسیان بکـەم یـان هـیچ نـەبێت وەبیر خوێنـەری ئێـستا و ئەندامانی ئەوسایی کۆمەڵەیان بهێنمەوە

پشکۆ نەجمەالدین

## سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانین بۆ سەرنوسەری ئەو گۆڤارانەی کە بابەت و نوسینمان لێوەرگرتوون.

١- گۆڤاری جیهان، بەرێز و خۆشەویست / نەبەز گۆران

٢- گۆڤاری لڤین ، بەرێز و خۆشەویست / هەردوو بەرێزان( احمد میرە و هێمن باقر )

٣- گۆڤاری رێگا، زۆر بەرز / سۆران عمر

٤- گۆڤاری بزاو، بەرێز / بۆتان تەحسین

٥- گوڤاری ستاندارد و تەواوی ستافە بەرێزەکەیان.

٦- گۆڤاری هەڵبون و ستافە خۆشەویستەکەیان.

٧- گۆڤاری شەن و ستافە ئازیزەکەیان.

٨- گۆرڤاری خەڵك، بەرێز سەردەشت حمە صاڵح

*- هەروەها سوپاس و پێزانینی تایبەتیمان بۆ هەرسێ جەریدە فرۆشی بەرێز و خۆشەویست:

کاك دارای گۆرا نخواز لە بازاری دەبووەکە.

کاك نەوشیروان لە بەردەرکی سەرا.

کاك سیروان بەرامبەر تەلاری کاوە.

لە کۆکردنەوەی گۆڤارەکاندا یارمەتییان داین و هیوامان وایە کە نمونەیان زیاتر بێت.